زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

02

# نوسەیبەی کچی کەعب






حبيب محمد سعيد

٢

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

# نوسەیبەی کچی کەعب

نوسینی

حبیب محمد سعید





# نوسەیبەی کچی کەعب


| | |
|---|---|
| نوسینـــــــی | حبیب محمد سعید |
| بـلاوکـردنــەوەی | نوسینگەی تەفسیر - کتێبخانەی سۆز |
| نــەخشــەسـازی | ئەمین مخلص |
| خـــــــە ت | نــەوزاد کۆیــی |
| بـــــــەرگ | ئەمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ | سێیەم ١٤٣٥ ك - ٢٠١٤ ز |
| تـــــــیراژ | ٢٠٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپیاردنی (١٨٨٠) ساڵی ٢٠١٣ پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر

بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

Mob: +964 750 460 51 22

Tel: +964 750 818 08 66

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

خوای پەروەردگارمان ! سوپاسی
بێپایانت ئەکەین وا خۆشەویستیی تاقە
پێشەوای مرۆڤایەتیی و هاوەڵە دڵسۆزە
بەغیرەتەکانیت پێ بەخشیوین ، تا
بەشکوم بە شوین پێ هەڵ گرتنیان لە
رێبازی ئیمان شارەزا ببین و ، بە
کۆمەکیی و پشتیوانیی خۆت بکەوینە
گەل کاروانی سەرفرازبووانی بازاڕی
قیامەت.

# پێشکەش

پێشکەش بێت ..

* بەو موسڵمانە خوێن گەرمانەی، کە بە جوانیی لە بارودۆخی ئێستای دینەکەیان گەیشتوون و بەو پێیەش بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتیی هەنگاو هەڵ ئەگرن .

* بەو خوشك و دایکانەی، کە ژیانیان بۆ پارێزگاریی لە رێبازە شیرینەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەرخان ئەکەن .

* بەو باوك و دایکانەی کە نەوەکانیان بە پەروەردەی ئیسلامیی پەروەردە ئەکەن تا سەربازی فیداکار و کۆڵنەدەری ئیسلامیان لێ دەرچێت .

# پێشەکیی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين .

پێشەوا بەڕێزەکان ، بەتایبەتیی هاوەڵە شیرینەکانی پێغەمبەرمانﷺ هەنگاوی مەردانەیان بەرەو ڕەزامەندیی پەروەردگار ناوە .. بە شێوەیەکی بێ وێنە لێ بڕاون بۆ خزمەت کردنی دینی بێ گەردی ئیسلام.. یەکەم هەنگاویان بەخت کردنی سەروماڵ بووە .. دیارە هەر بیرو باوەڕێك شوێن کەوتووەکانی لە پێناویدا گیانیان نەکەنە قوربانیی، ئەوە ئەو بیروباوەڕە پووچەڵ و بێ نرخە.. هەر بیروباوەڕێکیش شوێن کەوتووەکانی مەبەستیان خۆشیی و ڕابواردن و ڕۆژ بەسەر بردن بێت ژێر چەپۆکیی بەولاوە دروێنەی هیچی تر ناکەن..

ئیسلام کە دیاری یەکی خوایی بێ وێنەیە ، ئەندامەکانی وەها پەروەردە ئەکا کە لە یەکەم هەنگاودا بە تەمای گیانیان نەبن .. گیانیان

بەخت بکەن.. کەواتە هەموو شتێکی تـر بـەخت کردنـی زۆر ئاسـانە.. گیانیـان بـەخت بکـەن بـە هیـوای بەهەشـت. ئـەی داخـۆ هـەڵگرانی بیروباوەڕەکانی تر چۆن لە روویان بێت داوای بەخت کردنـی گیانیـان لـە شـوین کـەوتووەکانیان بکـەن ؟ یـا بـە چـیی دڵخۆشـیان بکـەن ؟ بـە سـەرکەوتنی وڵات؟!! بـە بەدەسـت هێنـانی ئامانجـەکانی کۆمـەڵ ، ئاسوودەیی بۆ گەل ؟! هەرچەندە ئەمانە سـەرابی بیابـانن و کەسـێ بـە چاوی خۆی نایان بینێ ، بەڵام هەر چۆن بێ ئەو هەژارەی کە گیـانی لـە دەست ئەدا بۆ گەیشتنی ئەوانی تر بە ئەنجام ، چیی دەست ئەکەوێ؟ کێ بیری بەلایەوە هەیە لە کاتی سـەرکەوتن و ئاهـەنگ و خۆشـییدا ؟ کـێ منالە کۆرپەکانی بلاوێنێ؟ بە چاوی خۆمان زۆرمان دی ! هەر چۆن بـێ، توخوا ئـەو بیروباوەڕانـە ئەوەنـدە ئـەژین تـا شـوین کـەوتووەکانیان لـە پێناویاندا گیانیان بەخت بکەن؟! ئەوانەی کە گێل و نـەفامن خۆیـان بـە دەم رووبارەوە ئـەدەن ، کەچـیی ساختەچـیی یـە بەرژەوەنـدیی پەرسـتە بەکرێ گیراوەکان لە دواوە خۆیان مەڵاس ئەدەن و بە وشـەی رازاوەی پـڕ لە ساختە سۆزی چاوبەستراوەکان ئەجوولێنن ، چونکە زۆر چـاك ئـەزانن کە حەیفە لە پێناوی ئەو رێگایانەدا خۆیان تیا بچن ..

لە ئیسلامدا بە پێچەوانەوە ، ئەوانەی کە پێشـەوان و بـە چـاکیی و پوختەیی لە ئیسلام گەیشتوون پێش هەموو کەس گیانیان بەخت ئەکەن، خوای گەورەش ئەوانە بە شەهید هەڵ ئەبژێرێ و کە دڵ و دەروونیـان بـە

راستێتیی ئیسلام پڕ بووه و، به دڵ و به گیان بۆ ڕەزامەندیی خوا هـەوڵ ئەدەن.. هەڵبژاردنی ئەم شەهیدانە لەلایەن خـوای خـاوەن دەسـەڵاتەوە، هێز و پێز به موسڵمانی دامەزراو ئەدات و، ئامـادەی مەیـدانی ئـەکا، کەوا به هیچ هێزێك فریو نەدرێت و هیچ هێزێکیش نەتوانێ بی ترسـێنێ و لـە ڕاسـتە شـەقام بـیترازێنێ . هـەموو دڵۆپێـك لـە خـوێنی ئـەو شـــەهیدانەش ئەبێتـــە هێـــز و وزە و ئەچـــێتە دڵ و دەروونـــی موســڵمانەکانەوەو، بــۆ خۆبــەخت کــردن و قوربــانیی دان لــە پێنــاوی بەرزکردنــەوەی ئــاڵای ئیســلامدا زیــاتر ســووریان ئــەکات و ، گیــانی شەهیدانە وا ئەبێتە بوومەلەرزەیەك و تەخت و کورسیی زۆرداران دێنێتە لەرزە و خەو و خۆراکیان لێ تێك ئەدات ..

جا بۆ سەلماندنی ئەوەی پێشەوە وا بزانم ئاوڕدانەوەیەك بۆ لای لاپـەڕە زێڕینەکانی مێژووی ئیسلام بەسە ، تا ئـەم ڕاسـتی یـەمان بـە چـاکیی لەبەر چاو ڕوون بێتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا جوامێریی و ئازایەتیی و بیروباوەڕی پتەوی ئـافرەتی موسڵمانمان بۆ دەرئەکەوێ کە هەر کاتێـك بـە پـەروەردەی قورئـان پـێ گەیشت ئەوا مرۆڤێکی گیـان بـەخش و لێهـاتووی لـێ دەرئەچـێ ، بـە پێچەوانەی پەروەردەی بەرنامــە نەفامییەکانــەوە کــە ئــافرەت ســوك و ڕیسوا ئەکەن و کاڵای بێ ئابڕوویی لەبەر ئەکەن.

وا بۆ نموونە ئەمجارە کورتە ژیانێکی دایـك و فەرزەنـدێك لـە هاوەڵـە خوێن گەرمەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەخەینە پێش چاو تا لـە هـەموو کات و شوێنێکدا پەند و ئامۆژگاریی بێت بۆ موسـڵمانان ، بـە تایبـەت موسڵمانانی ئەم سەردەمە کە دوارۆژی ئیسلام و موسڵمانەکان ـ بـەڵکو دوارۆژی مرۆڤایەتیی ـ بە لێهاتن و لێبڕانی موسڵمانەکانەوە بەسـتراوە ، تا بزانن سەروماڵ جۆرە خۆشەویستییەکی هەیە و بیروباوەڕیش جـۆرێکی تر.. تا بزانن ژیان ئەوەندە خۆش و خۆشەویستە کە بیروباوەڕ لـە ژیانـدا بێت و، هەر کاتێك ژیانی بیروباوەڕ بکەوێتە مەترسییەوە پێویستە ژیانی لاشە بکرێتە قوربانی تا ئەو ببووژێنێتەوە و گەڵاکانی هەر گەشەدار بن. ئەم دایك و فەرزەندەش نوسیبەی کچی کەعبی مازنیی و حەبیبی کـوڕی زەیدی کوڕیەتی..

# پەیمانی مێژوویی

قوڕەیش تەنگی بە پێغەمبەر و بە موسڵمانەکان هەڵچنی بوو .. ماوەیەك بوو بە دەست ئازار و لێدانیەوە ئەتلانەوە .. بەڵام شەوەزەنگ هەرچەندە درێژە بکێشێ رۆژ هەر ئەبێتەوە .. درەختی ئارامیی کۆمەڵی موسڵمان هاتە بەر .. بەرێکی پڕ تام و لەزەت .. بەکەڵك و سوودبەخش : کۆمەڵێك لە دانیشتوانی شاری یەسریب موسڵمان بوون .. بوونە کۆمەك و پشتیوان بۆ کۆمەڵی چەوساوەی موسڵمانی شاری مککە .

ئەوانەی یەکەم پەیمانی عەقەبەیان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دوانزە کەس بوون ، لەگەڵ ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) دا گەڕانەوە شاری یەسریب و دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی ئیسلام .. زۆربەی ماڵەکانی یەسریب بەخێرهاتنی ئیسلامیان کرد ، بە تایبەتیی خێزانی زەیدی کوڕی عاصیم ی ئەنصاریی کە خۆی و هاوسەرەکەی و هەردوو کوڕەکەی عەبدوڵڵا و حەبیب بە جارێك موسڵمان بوون ..

ئەم خێزانە چۆن موسڵمان بوو ؟

شەوێکیان زەیدی کوڕی عاصیم بە روویەکی گەشاوەوە و بە دڵێکی فراوانەوە گەڕایەوە ماڵەوە .. خۆشیی و کامەرانیی لێوی هێنابووە

خەندە. کاتێ خەوتن لەگەڵ نوسەیبەی خێزانیدا کەوتنە وت و وێژ، پاشان هەواڵێکی گرنگی پێ دا ..

زەید وتی : ئەمشەو لە کۆڕێکدا بووم کە ناودارانی یەسریبی تێدا کۆبوونەوە و ، مامۆستایان ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) بوو کە نێرراوی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموطەللیبە کە ئەڵێت خوا ناردوویەتی بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتیی بە تێکڕا لە تاریکیی و ژیانی ئاژەڵییەوە بۆ سەر راستە ریگای رووناکی ئیسلام و، تا ستەمکاران و مونافیقان بە سزای سەختی رۆژی دوایی بترسێنێ ..
نوسەیبە وتی : باشە ئامینەی کچی وەهب دایکی موحەممەد نیە ؟

زەید وتی : بەڵێ .

نوسەیبە وتی : کەواتە بە خزمایەتیی بە یەك ئەگەین .

زەید وتی : راست ئەکەیت .

نوسەیبە وتی : ئەی قورەیش چیی کرد ؟

زەید وتی : ئەمە بوو کە ئەم ویست باسی بکەم . بە بڵاوبوونەوەی ئیسلام قورەیش ترس و لەرزی لێ نیشت و کەوتە بەربەرەکانیی بۆ پاریزگاریی لە پایە و دەسەڵاتی ، چونکە موحەممەد بت و خواکانیان بە سووك و بێ نرخ دائەنێ ، قورەیشیش دەستی دایە ئازاردانی

موسڵمانەکان و بە هەموو شێوەیەکی ناڕەوا بـە گـژ بانگـە پیرۆزەکەیـدا چوو ، درۆ و دەلەسەی زۆری بۆ هەڵبەسـت و ، هـەموو ڕێگایـەکی لـێ گرت ، بەڵام بە هیچ شێوەیەك تینی سـارد نـەبووەوە و لـە جیهـادکردن وازی نەهێنا .

نوسەیبە وتی : بەڵام ئایا موحەممەد راست ئەکا؟

زەید وتی : ئەوەی کەوا هەموو گومانێك لە دڵدا ناهێڵێت ئەوەیە کە قورەیش بەڵێنی سامانێکی زۆر و ئەوپەڕی گەورەیی و دەسەڵاتی دا پێی ، کەچیی ئەمە دڵـی ئـەوی رانەکێشـا .. جـا ئەگـەر کـابرا مەبەسـتی رابواردنی دنیا بوایە ئەوا دەستی کەوتبوو ، بەڵام ئەو بە راستیی بۆ لای خوا بانگ ئەکات .

نوسەیبە وتی : بە وتەکانتدا وام بۆ دەرئەکەوێ کە ئەم بانگ و بانگ کەرەت زۆر لا پەسەندە ..

زەیـد وتـی : بـەخوا ، نوسـەیبە مـن لـەم بارەیـەوە لـە سـنووری پەسەندکردن نەوەستام بەڵکو بڕوام هێناوە و شایەتییم داوە کـەوا تـەنها یەك خوا هەیە کە شایانی پەرستن بێ و موحەممەدیش نێـرراوی خوایـە . جا ئەگەر بە گوێی خۆت وتەکانی موصعەبت ببیستایە کـە چۆن باسـی موحەممەد و بانگەوازەکەی ئەکرد ئـەوا خۆتـت پـێ نەئـەگیرا و ئیمانـت نەهێنا .

وتەكانی زۆر لە هەنگوین شیرین تر بوون .. وەك گەوهەر لـە دەمـی ببارێت .. گوێگرانیش هەموو لـە خۆشـیی و شـیرینیی وتەكانیـدا وەك باڵدار دڵیان هەڵفڕی بوو .. لەم باسەوە ـ كـە وەك باخچـەیەكی رازاوەی دڵ ڕفێن بوو ـ دەی بردە سەر باسێكی تر كە لـەو دڵ ڕفـێن تـر بـوو .. نوسەیبە ! مرۆڤ لە سایەی ئەم بەرنامە و یاسا خـواییـیـەدا هەسـت بـە بوون و ، رێز و ، مرۆڤایەتیی خۆی ئەكات .

لەم كاتەدا بە وێنەی دەنگە گەوهـەر فرمێسـك لـە چـاوی نوسـەیبە ئەڕژانە خوارەوە و ئەی وت :

بڕوام هێناوە بە پەروەردگارێتیی خوا و پێغەمبەرێتیی موحەممەدﷺ.

پاشان باوەشی بـە مێردەكەیـدا كـرد و ماچـی كـرد و هـەردووكیان بەڵێنیان دا كەوا لە وەرزی حەجی داهاتوودا لەگەڵ پەیماندەرەكان پـەیمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن ..

دوای ئەمانیش هەردوو كوڕەكەیان عەبدوڵلاّ و حەبیب ئیمانیان هێنـا و كەوتنـە شـوێن بـانگی ئیسـلام و بـەڵێنیان دا كـە دوو سـەربازی كۆڵنەدەری ئیسلام بن هەرچەندە حەبیب زۆر منداڵ بوو .

وەرزی حەج كردن هاتە پێشـەوە .. لـە هـەموو كـون و قوژبنێكـەوە خەڵكیی بەرەو كەعبەی پیرۆز كەوتنە رێ ، خەڵكی لـە شـاری مەككـە

جەم بوون .. دانیشتوانی یەسریبیش بەشداریی ئەم کۆبوونەوەیان کرد. وا ساڵێکیشە موصعەبی کوڕی عومەیر خەریکی بانگ کردنی دانیشـتوانی یەسریبە .. ئـەوەبوو سـاڵی رابـوردوو دوانـزە کـەس موسـڵمان بـوون و پەیمانی یەکەمی عەقەبەیان لەگەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ بەسـت ، وا ئەم ساڵیش حەفتا و سێ پیاو و دوو ئافرەتی موسڵمان لـە یەسـریبەوە ، بە نـاوی حەجـەوە و ، بـە نیـازی پەیمانـدان بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گەیشتنە مەککەی پیرۆز ..

موصعەب گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا و ، سەلامی لێ کـرد و ، مژدەی دایە کەوا بانگەوازی ئیسلام کۆمـەڵێکی دڵسـۆزی بـەغیرەتی دانیشتونی یەسریبی راکێشـاوە و بوونەتـە پاڵپشـت بـۆ ئیسـلام و ، وا هاتوون بۆ پەیمان بەستن و بەڵێندان کەوا بە دڵ و بە گیان شوێن کەوتـەی ئیسلام بن . خەندە کەوتـە سـەر لێـوی پێغەمبـەری خـوا ﷺ .. دڵـی کرایەوە .. سوپاسی خوای پەروەردگاری کرد .. بۆیە کاتێکی بۆ دیـاریی کرد تا بە پەنهانیی لەگـەڵیان کـۆ ببێتـەوە . شـەو داهـات .. بـازاڕ و کۆڵانەکانی مەککە لە هاتوچۆکەران چۆڵ بوو ، خـەڵکیی چـاویان چـووە خەو .. دنیا کش و مات بوو .. بەشێك لە شـەو تێپـەڕیی و جگـە لـە کۆمەڵێك هیچ کەس بەخەبەر نـەما . ئـەو کۆمەڵـەش میوانـە بـەڕێزە یەسریبیەکان بوون .. حاجیە موسڵمانەکانی یەسریب بوون .. چاوەڕێیان کرد تا هاوڕێکانی تریان خەوتن ، ئەوسـا یـەك یـەك و دوو دوو خۆیـان

گەیاندە عەقەبە . ئەو موسڵمانە دڵ گەرمانە لە عەقەبە کۆبوونـەوە و ، دوای تێپەڕبوونی سێیەکی شەو ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عەبباسـی مامەیدا گەیشتنە لایان .

دوای ئەوەی عەبباس مەترسیی و ئەرک گرانیی ئەم پـەیمان بەسـتنەی روون کردەوە بۆ یەسریبییەکان ، تا بزانن چۆن موسڵمان ئەبن و پاراسـتنی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای کۆچ کردنی بـۆ یەسـریب ئـەرکێکی گرانــە و لەوانەیــە هــەموو عــەرەب ببێتــە دوژمنیــان ، ئــەوانیش بەوپــەڕی ئاگادارییەوە پەیمانیان بە پێغەمبەر ﷺ دا کەوا بە سەروماڵەوە ئامادەی هەموو بەخت کردنێك ئەبن .

لە راستییدا لە بارەی بانگ کردنـەوە ئیسـلام هەڵوێسـتی تایبـەتیی خۆی هەیە ، جیاواز لە هەموو ڕێبازەکانی تر .

ئیسلام یەکەم رۆژ و دوارۆژی بانگ کردنی یەك شێوەیە، بـە شـێوەی ڕێبازە نەفامییەکان پێویستیی کاتیی مـرۆڤ ناکاتـە داردەسـت تـا دژی لایەك بووەستێ و بە وتەی لووس و بەڵێنی ساختە دڵی خەڵك راناکێشێ و، گێلیی و بێئاگایی مرۆڤەکان ناکاتە هۆ بۆ فریودانیان .. یا هەڕەشـە و ترساندن بەکار ناهێنێ بۆ ملکەچ کردنـی مرۆڤـەکان . بـەڵکو یەکـەم جار هەوڵی رزگارکردنی مێشك و دەروون ئەدا تا مرۆڤ بتوانێ چـاك لـە خراپ جیا بکاتەوە.. ئەوسا ڕێبازی راستیی ئەخاتە بەردەمی ، تا ئەگەر

خوا هیدایەتی دابوو بە ویستی خۆی شوێنی بکەوێ، هەتا ئیسلام پشت بە دڵ کرانەوەی کاتیی نابەستێ ، بەڵکو ماوەیەك موسڵمان بوون دوا ئەخات ، تا ئەو کەسە باش بیر لە خۆی بکاتەوە و جوانتریش شارەزای ئیسلام ببێت .. کورتەکەی موسڵمانان پێویستە یەکێ بانگ بکەن بۆ ئیمان هێنان کەوا بە جوانیی لە ئیسلام گەیشتبێ .. پێویستە مافەکان و ئەرکەکان .. تەنگ و چەڵەمە و دڕك و داڵی ڕێگا ئاگادار بێ .. پێویستە ئامادەی بەخت کردنی گیان بێت . ئەگینا ( زۆر بێ و بۆر بێ ) لە ئیسلامەوە زۆر دوورە .

بەڵێ موسڵمانە هۆشیارە چاوکراوە یەسریبیەکان بە جوانیی ئاگادار کران کە پەیمان بەستن بریتییە لە بەخت کردنی ( سەروماڵ ) . بۆیە هەموویان بە دڵ و بە گیان پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەست و ڕەزامەندیی خۆیانیان دەربڕیی بۆ پارێزگاریی ئیسلام و پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیان ﷺ دیارە زەیدی کوڕی عاصیم و نوسیبەی خێزانی و عەبدوڵڵا و حەبیبی کوڕیشیان لەناو پەیمان دەرەکاندا ئامادە بوون و بە ڕاستیی و پاکیی بڕیاریی خزمەتی ئیسلامیان دا ..

میوانەکانی ماڵی خوا و پەیمان دەرە یەسریبیەکان گەڕانەوە بۆ یەسریب .. میوانە ئازیزەکان هەر لە دوورەوە بە بێ چاو پێ کەوتنی پێغەمبەری نازدار ﷺ موسڵمان بوون ، کاتێکیش کە بە دیداری خۆشەویستی خوا ، یانی پێغەمبەری خوا ﷺ شاد بوون ، دڵ خۆش و

بەختیار بوون و دڵ و دەروونیان پڕ لە ئیمان بوو و هەستیان بە سەربەرزیی و پشتیوانارییەکی بێ ئەندازە ئەکرد ، خێزانە دڵ هۆشیارەکەی زەیدیش لەگەڵیاندا گەڕایەوە .. بە تایبەتیی نوسەیبە ، بەڵام چۆن گەڕانەوەیەك ! بە دڵ و دەروونێکی پڕ لە خۆشیی و کامەرانییەوە .. بە خۆشەویستییەکی بێئەندازەوە بۆ ڕێبازی ڕاست و ڕووناکی پەروەردگار . هەموو هەست و بیرێکی هاتە سەر بانگ کردن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ و ، سەروکاریی ماڵەکەی و پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانی بە پەروەردەیەکی ئیسلامیی .. بە هەموو شێوەیەك لێ بڕا تا ئیسلامی بێ گەرد پێشکەش بە خزم و ناسیاو و ئاشناکانی بکات .. تا مرۆڤەکان لە تاریکیی ڕزگار بکات و بیانخاتە سەر ڕێبازی ئیسلام .. هەڵپە و پەلەقاژە و خەم خواردن بۆ جیهانی کورت و بێ بایەخی نایە ئەولاوە ، بە مەردانە لێ بڕا بۆ ڕەزامەندیی خوا و بە دەست هێنانی بەهەشت .. ژیانی پڕ خۆشیی و کامەرانیی هەتا هەتایی و نەبڕاوەی هەمیشە ڕازاوەی دوور لە تەنگ و چەڵەمە و خەم و خەفەت . دوای ئەو پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ یەسریب کرد و ناوی نا مەدینەی مونەووەرە . خەڵکی مەدینەش بەخێرهاتنێکی بێ ئەندازەیان لێ کرد .. خۆشیی کەوتە دڵانەوە .. ئەوانەش کە بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەیشتبوون بە بینینی شاد بوون ..

# جەژنی سەرکەوتن

ویستی خوا وابوو شاری مەدینە ببێتە بنکەی یەکەمی بانگەوازی ئیسلام .. ویستی وابوو ئەو بەهرە گەورەیە پێشکەش بە دانیشتوانی مەدینە بکات .. مەدینەییەکان خوا پێداو بوون کە لە نێو هەموو عەرەبەکاندا باوەشی خۆشەویستیی و پارێزگارییان بۆ پێغەمبەر و بانگە پیرۆزەکەی و موسڵمانە کەم هێزەکان کردەوە .. کە باوەشیان کردەوە زۆر بە مەردانە بە دەم بانگەوازی خواوە هاتن ..

زۆر بە پیاوانە قۆڵیان لێ هەڵ مالّی .. یەکەم جار سامانەکەیان خستە ژێر پێی برا موسڵمانە لێ قەوماوەکانیان . پاشان لە کاتی هێرشی نەفامییدا بۆ کوژانەوەی چرای ئیسلام گیانیان خستە سەر لەپی دەستیان و سنگیان کردە قەڵغان بۆ پاراستنی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ..

یەکەم تێهەڵچوونی موسڵمانەکان و خوانەناسەکان لە ( بەدر ) دا بوو .. یەکەم دەستێ کە لەشکری کەم و کەم تفاقی خوا وەشاندی لە لەشکری زۆر و بەدەسەلاّتی شەیتان، لە ( بەدر ) دا بوو .. جا لەبەر

ئەوەی بە راستیی و پاكیی مەبەستیان بەرزكردنــەوەی ئیســلام و بــڕینی نینۆكی خوێن مژان بــوو .. دوور لــە بەرژەوەنــدیی كــاتیی و ئــارەزووی دەروون ، خوای گەورە دەسەڵاتی خــۆی بــۆ پشــت گیریــی موســڵمانەكان خستە كار ، تا پشتی نەفامیی بە زەوییدا بدەن .. موسڵمانەكان بــە دڵ و بە گیان لێ بڕابوون بۆ شكست دان بە قوڕەیشی پڕ لە فیــز و دەمــار ، بۆیە خواش دەستی یارمەتیی بۆ درێژ كردن ..

هەموو ئەندامەكانی كۆمەڵی موسڵمان بۆیان نەكرا ئامادەی جــەنگی بەدر بن ، بۆیە لە خێزانی ( زەیدی كوڕی عاصیم ) یشدا وا دەرئەكــەوێ كە تەنها عەبدوڵلا بەشداریی كردووە ، چونكە حەبیب زۆر منداڵ بوو .

عەبدوڵڵای گەنجی خوێن گەرم كە بە ئامۆژگارییــەكانی دایكــی دڵ و دەروونی پڕ لە باوەڕ بە خــوا و خۆشەویســتی بــۆ ئیســلام بــوو لــە مەیدانی جەنگدا بە گورج و گۆڵیی هەڵ ئەسووڕا .. هەر كــاتێ هەســتی بە ماندوویەتیی بكردایە ، وتە بەنرخەكانی دایكــی ئەهاتنــەوە یــادی و خێرا ماندووبوونی لەبیر ئەچۆوە و بە مەردانە وەك شێری بێشە هەڵمەتی ئەبردە سەر لەشكری سەر لێ شێواوی شەیتان ..

موسڵمانەكان ســەركەوتن .. دەنــگ و بــاس گەیشــتەوە مەدینــە .. دانیشتوان هاتنە دەرەوەی شار بە پیری پێغەمبــەر و موســڵمانەكانەوە ،

تا پیرۆزبایی سەرکەوتنی ئیسلامیان لیّ بکەن .. نوسەیبەش یەکێك بوو لەوانە تا بە دیداری عەبدوڵلاّی کوڕی شاد ببێتەوە ..

کوڕە شیرینەکەی گوشیی بە خۆیدا .. ئەم لاو ئەو لای ماچ کرد و ، بە فرمێسکی خۆشیی سەرکەوتنی ئیسلام و گەڕانەوەی جگەرگۆشەکەی ، تۆز و خۆڵی مەیدانی جەنگی سەر دەم و چاوی عەبدوڵلاّی شۆرییەوە .

شاری مەدینە جەژنیەتی ، بەڵام چۆن جەژنێك ، ئیسلام سەرکەوتووە .. قوڕەیشی خاوەن فیز و دەمار لەناو عەرەبدا سووك و ریسوا کراوە .. سەرکردە خوێن مژە ورگ زلەکانی بوونەتە سووتەمەنیی جەنگ .. لەولاوە جوولەکەکان و مونافیقەکانی مەدینە خەریك بوون خۆیان ئەخواردەوە .. وەك مار پێچیان ئەدایە خۆیان .. بەڵام ئەوانە و هاوچەشنیان سەرەنجام هەر ئەوە بەشیانە ، ئەبێ بە سك یەشەوە بتلێنەوە .. بانگی ئیسلام هیچ کۆسپێك ناتوانیّ لەبەر دەمیدا زۆر خۆی بگرێت ، شاخی دامەزراویش ناچارە بۆ هێرشی بەتینی ئیسلام مل کەچ بکات .

خێزانە بەختیارەکەی زەیدی کوڕی عاصیم خۆشیی و کامەرانیّیان لیّ تێك چوو ..زەیدی سەرگەورەیان کۆچی دوایی کرد .. نوسەیبەش بە کۆچکردنی خۆشەویست و هاوسەری ژیانی زۆر دڵ گران بوو .. پڕ بە دڵ بۆی گریا .. بەڵام موسڵمان ئاساییی ، بە فەرمانی خوا رازیی بوو،

چونکە، ویستی خوا لـە ژووررووی هـەموو شـتێکەوەیە و، هیواشـی بـە پاداشتی خوای گەورە زۆر بوو ..

ئەو سەردەمە ، سەردەمی حوکمی قورئان بوو ، کۆمـەڵیش کۆمەڵـە خـەڵکێکی موسـڵمانی راسـتەقینە بـوو.. وەك ئـەم سـەردەمە نـەبوو شوورەیی بێ بۆ ئافرەت مێردی تر بکا .. ئەو سـەردەمە بێئـابڕوویی و بەرەڵایی و بێ شەرمیی شوورەیی بوو . بۆیـە دوای تـەواوبوونی مـاوەی شەرعیی ، ( غوزەییـەی کـوڕی عـامر ) هاتـە خـوازبێنیی نوسـەیبە و ئەویش شووی پێ کرد ..

# هەڵمەتی ئیمان

قورەیشی خوانەناسی لە بەدردا پشت شکاو دوای گەڕانەوەی لە بەدرەوە ، دوای تەواوبوونی شیوەن و واوەیلا بۆ گۆڕکراوە دۆزەخییەکان ، کەوتە خۆ کۆ کردنەوە و خۆپێچانەوە بۆ تۆڵەسەندن لە موسڵمانەکان ، لە ساڵی سێهەمی کۆچییدا سێ هەزار جەنگاوەری بەرەو پایتەختی ئیسلام خستە ڕێ .. قورەیش لە دەشتی نێوان شاری مەدینە و شاخەکانی ئوحودی نزیك مەدینەدا مۆڵی دا .. هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری پێشەوا ﷺ .. ئەمیش هەزار جەنگاوەری موسڵمانی دوای ڕا و تەکبیر خستە ڕێ .. بۆ کوێ ؟ لەبەردەم لەشکری قورەیشدا مۆڵگای دروست نەکرد، بەڵکو لە پشت لەشکری قورەیشەوە لە بناری شاخی ئوحوددا شوێنی خۆیان گرت .. واتە قورەیش کەوتە نێوان لەشکری موسڵمانەکان و مەدینە .

بەڵێ جەنگ بەرپا بوو .. موسڵمانەکان بەبێ ئاگا ، وا قورەیش هاتۆتە سەریان تا تۆڵەی بەدر بکاتەوە ، هاتووە سام و هەیبەتی موسڵمانەکان لەناو هەموو عەرەبدا نەهێڵێت ..

---

ئـەوەشمان لـە بـیر نەچـێ کـە عەبـدوڵڵای کـوڕی ئوبـەی سـەرۆکی مونافیقـان بـە خـۆی و(٣٠٠) سـێ صـەد جـەنگاوەرەوە گەڕانـەوە بـۆ مەدینە.

موسڵمانەکان هەڵیان کوتایە سەر قورەیش و شێرانە شمشێریان خستە گەردنیان ، ئەوەبوو تیرهاوێژەکان شـوێنی خۆیانیـان بـەجێ هێشت و ، خالد ـ کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو ـ شاخەکەی لە دەست پاشماوەکەیان سەند و، سەرۆکەکەشیان شەهید کرا و ، موسڵمانەکان کەوتنە نێوان دوو لەشکرەوە و گەمارۆ دران و ، تا خۆیان لەو بازنەیەی دەوریان رزگار کرد و ، خۆیان گەیاندەوە لای پێغەمبـەری خۆشەویست ﷺ حـەفتایان لـێ شەهید کرا .. پێغەمبەری خواش ﷺ لە چەند لایەکەوە هێرشـی کرایـە سەر هەتا ئاڵاکـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کەوتـە زەویـی .. ئەوپـەڕی شکستیی بـوو کـە بەسـەر موسـڵمانەکاندا هـات ، بـەڵام شکسـتی لێ قەومان و هەڵـەکردن .. هەڵـەکردنێکی کـاتیی .. لـەم کاتـە ناسـکەدا ئەوەبوو چەند کەسێکی کەم لـە دەوری پێغەمبـەردا ﷺ مابوونـەوە بـۆ پارێزگـاریی ، هەنـدێکیان شـەهید بـوون و ، هەنـدێکیش لـە ترسـانا هـەڵاتن!! تـرس و لـەرزی ئـەو سـاتە بـێئەنـدازە بـوو .. بـە جارێـك موسڵمانەکان سەریان لێ شێوا بوو ..

ئـەوەبوو نوسـەیبەش خـوا لێـی رازیـی بێـت رۆژی ئوحـود لەگـەڵ مێردەکەیدا و لەگەڵ لەشکردا بەشداریی کرد.. نەك بۆ جـەنگ ، بـەڵکو

بۆ تیمارکردن و ئاودان به جەنگاوەران . کاتێ ئەم هەڵوێستە دڵتەزێنەی به لەشکری خواوە دیی ، خۆی پێ نەگیرا .. هەستی جووڵا .. غیرەتی جۆشی دا .. هاتەوە یادی کە لە پەنای کەعبەدا چ پەیمانێکی گەورەی لەگەڵ خوا و پێغەمبەری خوادا بەستووە و ، چۆن خۆی و کورەکانی و هەرچیی دارایی هەیە نەزر کردووە لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامدا .. کوندەی ئاوی فڕێ دایە ئەولاوە و شمشێرێکی لە کێلانەکەی دەرهێنا و دەستی کردە بەرگریی لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ، بە وێنەی شاخی دامەزراو پێی لە زەویی داکوتا و کۆڵی نەئەدا ، لەگەڵ مێردەکەی و عەبدوڵڵای کوڕی و چەند کەسێکی کەمدا کە نەئەگەیشتنە دە کەس پێغەمبەریان ئەپاراست و لە دژی شاڵاوی هێرشی خوانەناسەکان ئەوەستان .. ئەم کۆمەڵە کەمەی دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ وەك نەڕەشێر ئەجەنگان و ترس کاری تێ نەئەکردن ، بەڵکو بە دەنگی بەرزیش دامەزراویی و کۆڵنەدانیان بە گوێی موسڵمانەکاندا ئەدا..

نوسەیبە تەنها شمشێرێکی بە دەستەوە بوو .. بەبێ قەڵغان ئەجەنگا ، خۆی و پێغەمبەری ﷺ ئەپاراست ، بە رادەیەك کە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتیی بۆ داوە کە ئەی فەرموو : « مَا الْتَفَتُّ يَومَ أُحُدٍ يَمِيناً وَلاَ شِمَالاً إلاَّ وَأَرَاهَا تُقَاتِلُ دُونِي » .

ئەی فەرموو : رۆژی ئوحود هەرچیی بەلای راست و بەلای چەپدا سەیرم ئەکرد نوسەیبەم ئەدی لە پێناوی پاراستنی مندا ئەجەنگا ..

هەر کە پێغەمبەر ﷺ چاوی پێ کەوت کەوا بە بێ قەڵغان جەنگ ئەکا و پیاوێکیشی بەدیی کرد کە ئەیویست را بکات پێی فەرموو : قەڵغانەکەت دانێ بۆ ئەوەی کە جەنگ ئەکات .. ئەویش دای نا و نوسەیبە هەڵی گرت و خۆی و پێغەمبەری ﷺ پێ ئەپاراست ، لەو لاوە سوارێکی قورەیشی هەڵمەتی دایە سەر نوسەیبە و شمشێرێکی بۆ داهێنایەوە ، بەڵام باش بوو قەڵغانەکەی دایە بەری و کاری تێ نەکرد و کابرا لێی تێپەڕیی ، پاشان نوسەیبە کەوتە سەری و شمشێرێکی لە پشتی ئەسپەکەی دا و کەوتە زەویی . جا پێغەمبەر ﷺ بانگی کردە عەبدوڵڵا تا بگاتە فریای دایکی ، عەبدوڵڵاش خێرا گەیشتە لای دایکی و لە کوشتنیدا یارمەتیی دا ..

لە بیرمان نەچێ کەوا ( حەبیب ) ی کوڕی هێشتا منداڵ بوو و لە ئوحودیشدا بەشداریی نەکرد .

لەم کاتانەدا عەبدوڵڵا زامدار کرا .. دایکی هات تا زامەکەی تیمار بکا و پێغەمبەریش ﷺ سەیری ئەکردن . کاتێك لە تیمارکردن بووەوە وتی : هەستە کوڕەکەم با بچینەوە بە گژیاندا . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوەی تۆ بەرگەی ئەگریی کێ بەرگەی ئەگرێ ئەی دایکی عومارە ؟

هەڵوێستێکی زۆر دڵ تەزێنـە .. ئەوانـەی بیر لـە رزگـاریی و سەربەستیی ئەکەنەوە ، با فیداکاریی و خۆنەویستن لە دڵ و دەروونیانـدا بڕوێنن . جا چۆن ئەڕوێ ؟ بەو چیرۆکە سووك و ریسوایانەی پێنووسە بەکرێ گیراوەکانی دوژمنانی ئیسلام ئەیان نووسن ، کە بـەرەڵایی و بـێ ئابڕوویی بەشێکی فراوانی داگیر کردووە ؟ چۆن گەنجەکانمان ـ بـە کـوڕ و کچەوە ـ پەروەردە بکەین و فیداکارییان پیشان بدەین ؟ باوەڕ ناکەم هیچ خـاوەن هۆشـێك و خـاوەن ویـژدانێك تـا چـیرۆکی راسـتەقینەی ژیـانی پێغەمبەران و شوێن کـەوتووە دڵسـۆزەکانیان وەسـتابێ ، بـە تایبـەتیی پێغەمبەری ئیسلام و هاوڕێ خوێن گەرمەکانی بە پیاو و بـە ئافرەتـەوە دان بـە هـیچ چیرۆکێکی تـردا بـنێ ، بـە تایبـەتیی ئەفسـانە و درۆ و دەلەسەی رۆژگار کە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی راسـتەقینەیان نیـە ، یا چیرۆکی ئەندێشەی پێنووسە ژەهراوییە بە کرێ گیراوەکانی بێگانە.

ئەم هەڵوێستانەی نوسەیبە بەسن بـۆ پـەروەردەکردنی ئافرەتـان ، تـا شـان بـە شـانی پیـاوان فیـداکاریی خۆیـان بنـوێنن تـا لـە پێنـاوی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامی پیرۆزدا سەروماڵ بخەنە ئەولاوە .

کاتێ کە پێغەمبـەر ﷺ ئـەو پیـاوەی بـەدیی کـردەوە کـە دای لـە عەبدوڵلا و زامداری کرد ، پیشانی نوسەیبەی دا و فەرمووی : ئەمە بوو دای لە کوڕەکەت .. خێرا نوسەیبە چووە رێگەی و شمشێرێکی لـە قاچـی

دا و چۆکی پـێ دا .. پێغەمبـەر ﷺ ئەوەنـدە پێکـەنیی هـەتا دانـی دەرکـەوتن و ، فـەرمووی : تۆڵـەی خۆتـت لـێ کـردەوە، ئـەی دایکـی عومارە.

نوسەیبە کابرای داگرتەوە هەتا ئەوەنـدە زامـی تـێ کـرد بـە جـارێ کوشتی . جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :

سوپاس بۆ ئـەو خوایـەی کـە سـەری خسـتیت و ، دوژمنەکـەی بـۆ دۆزیتەوە و ، بە دەستی خۆت تۆڵەی خۆتت لێ کردەوە.

عەبدوڵلا بە زامداریی خۆیەوە هێشتا بەرگریی لـە پێغەمبـەری خـوا ئـەکرد . دامـەزرا بـوو .. خراپـە و ئـازاری لـە پێغەمبـەر ﷺ دوور ئەخستەوە .. پێغەمبەر ﷺ چاوی لێ بوو پیاوێك بە روویانـەوە هـات ، پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد : عەبدوڵلا ! وتی : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا . فەرمووی : تێی گرە . عەبـدوڵلا بـەردێکی گرتـە پیاوەکـە و دای لـە چاوی ماینەکەی و بە خۆی و سوارەکەیەوە کەوتن.. بە بـەرد پیاوەکـەی داگرتەوە تـا بـە یـەکجاریی کوشـتی .. ناڵـە و نەبـەردی جـەنگ هـەر بەردەوام بوو .. هێرش دوای هێـرش لـەلایەن خوانەناسەکانەوە ئەکرایـە سەر پێغەمبـەری خۆشەویسـت ﷺ بـەڵام فیـداکاریی و چـاو نەترسـیی موسڵمانەکانی دەوروبەری پێغەمبەر نەی هێشت دوژمن بە ئاوات بگات

. هەتا دوایین هێرش کەوا سوارچاکێکی قورەیش بە ناوی ( ئیبن قەمیئە) وەك گەنەشامیی هەڵ ئەهاتەوە و هاواری ئەکرد :

موحەممەدم پیشان دەن ، رزگار نەبم ئەگەر ئەو رزگار بێت ، بەرەو رووی مەنزڵی پێغەمبەر کەوتبووە رێ ، موصعەبی کوڕی عومەیر و نوسەیبە رێگایان پێ گرت ، لە ئەنجامدا موصعەب شەهید کرا و بە بەهەشتی بەرین شاد بوو .. کاتێك کە نوسەیبە بە تەنیا لەبەر دەمیدا بە دامەزراویی مایەوە ئیبن قەمیئەی بە شمشێر داگرتەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی بە دوو زرێ داپۆشی بوو سوودێکی نەبوو ..

زۆر شانازییە بۆ ئافرەتان .. زۆر سەربەرزییە بۆ دایکان و خوشکانی موسڵمان کەوا لەناو ئافرەتاندا نوسەیبە و هاوچەشنانی هەڵکەوتوون .. سەربەرزییە بۆ ئافرەت ، لەو ساتە سەختەدا ئافرەتێك پێغەمبەری پێشەوا بپارێزێت کە زۆر جەنگ و هەرا دیدە بەرگەی ئەو نەبەردەیان نەئەگرت..

هێرش پەرەی سەند .. جەنگ گەرمتر بوو . پارێزگاریی کەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ یا شەهید کران ، یا رایان کرد ، بۆیە کەم بوونەوە و ئەرکی سەرشانی نوسەیبەش گرانتر بوو و، بە پێویستی زانی زیاتر قۆڵی مەردایەتیی لێ هەڵ بماڵێت ، ئەوە بوو بە راست و بە چەپدا هێرشی ئەبردە سەر دوژمنانی خوا .. لە هەموو لایەکەوە کافری

بێویژدان تیغیان ئاراستەی لەشی پیرۆزی ئەکرد تا لە بەر دەمیاندا نەمێنێت و دەستیان بگاتە پێغەمبەری خوا ﷺ .. نوسەیبە لە تاو هێرشی دوژمنان زۆر ماندوو بوو ، بە شمشێر و تیغەکانیان لە سیانزە شوێندا زامدار بوو .. خوێن لە لاشەی سەری کردبوو ، بۆیە کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەمەی دیی ، بانگی کردە عەبدوڵڵای کوڕی نوسەیبە :

دایکت ، دایکت ، زامەکانی ببەستە ، خوا فەڕو پیرۆزیی بڕێژێ بەسەرتاندا ، چۆن خێزانێکن ؟ پایە و پلەی دایکت لە پایە و پلەی ( فلان و فیسار ) چاکترە ـ ناوی دوو سێ کەسی برد ـ خوا رەحمتان پێ بکات .

لەم کاتە ناسکەدا .. بەو هەموو ئیش و ئازارەوە نوسەیبە گوێی لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا بوو .. گوێی لێ بوو لەو پایە و پلە بەرزەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دیاریی کرد ، مژدەی بەختیاریی دڵی نوسەیبەی هێنایە جۆش و هاواری کرد : ئەی پێغەمبەری خوا ! داوا بکە کە لە بەهەشتدا هاوڕێت بین .. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : خوایە بیان کەی بە هاوڕێم لە بەهەشتدا ..

به فەرمایشتی شیرین و داوای خۆشبەختیی دڵی نوسەیبە زیاتر هاتە جۆش و زام و زامداریی لەبیر چۆوە و بە دەنگی بەرز ئەیوت : باکم نیە لە جیهاندا هەرچییم بەسەر بێت ..

بەڵێ کە بڕوا لە دڵدا بە جوانیی جێی خۆی کردەوە بێ باك ئەبێ لە ژیانی سەرزەویی .

هەوڵ و کۆششی نوسەیبە بۆ پاراستنی پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئەهات لە زیادکردن دا بوو ، هەتا ویستی خوا وابوو موسڵمانەکان گلێر ببنەوە و پاڵ بە شاخی ئوحودەوە بدەن و ، دوژمنیش لە شوێن کەوتنیان و هێرش هێنانە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەست کۆتا بکەن .. بەمە تای تەرازووی موسڵمانەکان قورس بووەوە و قورەیش لەوە زیاتر نەیتوانیی دەست بوەشێنێ ..

قورەیش کە زانیی شکانی موسڵمانەکان و شەهیدبوونی حەفتا و زامداربوونی صەد و پەنجای تریان ـ کە خۆیان حەوت صەد کەس بوون ـ شکانێکی کاتیی بوو و ، بە هۆی هەڵەیەکەوە بوو کە کۆمەڵێکیان کردیان ئەویش بە دەرچوونیان لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ و، ئەوەش هەلێك بوو بۆ قورەیش تا بتوانێ دەستی وا بوەشێنێ ، ئەگینا لە جەنگی ئاساییدا توانای شکاندنی هێز و بازووی لەشکری خواناسی نیە .. کاتێ قورەیش ئەمەی بۆ روون بووەوە ، زانیی موسڵمانەکان بە

گلێربوونەوەیان چوونەتەوە شوێنی هێزی خۆیان . بۆیە بە ئاواتەوە بوو بەمە جەنگ کۆتایی پێ بێت نەوەکو موسڵمانەکان ئەمجارەش ـ وەك سەرەتای جەنگ ـ دەستێکی تر بوەشێنن و سەرکەوتنە کاتیەکەی بشۆنەوە ، بۆیە هێرشی قورەیش وەستا و ئەم بەرو ئەو بەر بە بانگ کردن بڕیار درا ساڵێکی تر لەو ڕۆژەدا وادەیان بەدر بێت بۆ جەنگ .. بەمە لەشکری قورەیش لە ترسی ئەوەی موسڵمانەکان ـ ئەگەرچیی شەهیدی زۆر و زامداری زۆریان هەبوو و ، ئەگەرچیی لەچاو قورەیشدا زۆریش کەم بوون ـ هێرشی بکەنە سەر . هەر ئەو ئێوارەیە ، بەرەو مەککە ملی ڕێگای گرتەبەر و بە پەلە لە مەیدانی جەنگ کشایەوە ، هەتا شاری مەدینەی بێ چەك و بێ جەنگاوەر لەبەر دەستیاندا بوو ـ چونکە موسڵمانەکان لە مەیدانی جەنگدا خەریکی ناشتنی شەهیدەکان بوون ـ نەی توانیی هێرشی بەرێتە سەر ، چونکە لە قووڵایی دڵی هەموو ئەندامێکیدا روون بوو کە هێشتا ئەو کاتەش توانای جەنگی موسڵمانەکانیان نیە .. بۆ شاهێدیی ئەمەش ئەوە بوو هەر بۆ سبەینێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا سەربازانی ڕۆژی ئوحود هەرکەس توانای دەرچوونی هەیە با دەرچێت و لەشکری موسڵمانەکان هەڵمەت ئەباتە سەر قورەیش و ڕاوی ئەنێت .

قورەیش نیازی وابوو لەسەر خۆ و بە فیزو دەمارەوە هەنگاو هەڵنێ و بەناو هۆزەکانی دوورگەدا سەرکەوتنی خۆی و شکستی موسڵمانەکان

بلاو بکاتەوە .. بـەلام کـێ بێـت غیرەتـی بگاتـە غیرەتـی پێغەمبـەری ئیسلام ﷺ ؟ کێ بێت چاونەترسیی بگاتە چاونەترسیی پێشەوای ئیسلام ؟ زۆر بە عاری ئەزانی قورەیشی بێهێز و پێز ئـەو سـەرکەوتنە کاتییـە بکاتە پاگەندە و موسڵمانەکانی پێ ریسوا بکا ..

بەڵێ ، بۆ سبەینێ موسڵمانەکان کەوتنە شوێن قورەیش .. هەندێ لە هەڵەوەڕەکانی قورەیش نیازیان وابوو بگەڕێنـەوە سـەر مەدینـە چـونکە بیریان کردەوە کە ئەوان لە بەدردا ئەبوجەهلی سەرکردەیان کوژراوە، دەی خۆ لە ئوحوددا موحەممەدی سەرکردەی موسڵمانەکان لە بریی ئەبوجـەهل نەکوژاوەتەوە . بەلام کە بیستیان وا لەشکری ئیسلامی نیوە زامـدار بـە شوێنیانەوەیە ، هەر ئەوەندەیان بۆ کرا گورجییان چەند جار زیاد بکەن و بە پەلە بەرەو پایتەختی بت پەرستیی بکەونە رێ .. نەك هـەر قـورەیش بەڵکو هوزەکانی دوورگە ـ بە تایبەتیی ئەوانەی کە چاویان لە هەڵمـەتی موسڵمانەکان و ڕاکردنی قورەیش بوو ـ لـە قـولایی دڵیانـدا سـەلما کـە هەرگیزاو هەرگیز لەشکری شەیتان بەرگەی لەشکری خوا ناگرێـت ، کـام کات زۆر ناسك بێت ، ئەوسا ناتوانێ لەبەردەمیدا راوەستێ .

ئەبێ ئەوەش بزانین کە قورەیشییەکان بەڵێنی ساڵی ئایندەیان نـەبردە سەر و کە زانیيان لەشکری موسڵمانەکان لە بەدر چـاوەڕێیان ئـەکات ، نەیان وێرا روو لە بەدر بنێن . نوسەیبە رۆژی دوای ئوحود ویستی لەگەڵ

لەشکردا بۆ راونانی قـورەیش هاوبەشـیی بکـات .. خـۆی کـۆکردەوە و زامەکانی توند پێچا ، کە ویستی لە ماڵ دەرچێت ، خـوێنی زامـەکانی بەربوو و ئێش و ئازار دای بـە زەویـیـدا و نـەیتوانیی لەگـەڵ لەشـکردا بڕوات ، ناچار مایەوە و چەند ژنێك ، بـۆ تیمـارکردنی زامـەکانی ، لـە دەوری بوون . موسڵمانەکان کەوتنە شوێن قـورەیش .. کـاتێ گەیشـتنە ناوچەی ( حـمراء الأسد ) بۆیان دەرکەوت تازە فریای قورەیش ناکـەون ، ئیتر گەڕانەوە ، کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشـتـەوە مەدینـە ، بـەر لـەوەی بگاتەوە ماڵ ، نێرراوی نارد بۆ هەواڵ پرسینی نوسەیبە و ، کـە بیسـتی مەترسیی لێ دورکەوتۆتەوە زۆری پێ خۆش بوو ..

لە راستییدا نوسەیبە مامۆستایەکی پێشڕەوە بۆ ئافرەتی موسڵمان تا چاوی لێ بکات و بتوانێ دەم کوتی دوژمنان بکات و پێیان بسەلمێنێ کە تەنها ئیسلام بە راستیی دەروونی ئـادەمیزاد ـ بـە پیـاو و ئافرەتـەوە ـ رزگار ئەکات و ، ئەو پڕوپاگەندانەی لە دژی ئیسلام بڵاو کراونەتەوە لـە راستییەوە دوورن و ئیسلام تاقە بیروباوەڕە، کە مافی بە ئـافرەت دابـێ ، تا پەروەردەی خۆی و نەوەی دوارۆژ بکات، بـۆ پێکـەوەنانی کۆمـەڵێکی پێشکەوتووی چاوکراوەی دڵسۆز، تا بتوانێ بـە مەردانـە دژی دوژمنـان بوەستێ و بەرگریی لە خاکی ئیسلام بکات .

# قیرسچمەیی نەفامان

قورئانی پیرۆز، بۆ پەروەردەکردنی کۆمەڵی موسڵمان و دارشتنی بناغەی یاسای هەتا هەتایی ئیسلام، بە پێی نەخشەی پەروەردگار ئەهاتە خوارەوە . تا ئەوەبوو ئایەتی ( حجاب ) هاتە خوارەوە .. نەخشەی بۆ ئافرەتی موسڵمان کێشا تا ئەرکی سەرشانی خۆی لە ناوەندێکی پاك و خاوێندا بەجێ بهێنێ .. نەخشەی بۆ ئافرەتی موسڵمان کێشا تا تێکەڵی پیاوی بێگانە نەبێت ، تا کۆمەڵی موسڵمانی رەوشت پاك دروست ببێت و ، ئافرەتیش لە ژار و ژەنگی ژیانی نەفامیی رزگاری ببێت .

ئافرەتانی کۆمەڵی موسڵمانیش بە دڵ و بە گیان ملکەچی فەرمانەکانی ئیسلام بوون ، هەر فەرمانێك بەسەریانا ئەدرا بە دڵ و بە گیان جێبەجێیان ئەکرد. نوسەیبەش ، یەکێ بوو لەو ئافرەتە گوێرایەڵە دڵسۆزانە ، بیری کردەوە ئیتر لەمەولا بە نیازی جیهادکردنەوە ناتوانێ لە ماڵ دەرچێت ، بۆیە بریاری دا هەردوو کورەکەی عەبدوڵلا و حەبیب لەسەر خۆشویستنی ئیسلام و خۆبەخت کردن و شەهیدبوون لە رێگای

خوادا پەروەردە بکا بۆ بە گژداچوونی لەشکری نەفامیی و بڕینی نینۆکی خوێن مژان و لەسنوور دەرچوان .

ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەلاّتی موسلّمانەکان لە زیادکردنا بوو ، تا سالّی شەشەمی کۆچی هاتە بەرەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە موسلّمانەکاندا دا کەوا خۆیان ئامادەی حەجی مالّی خوا بکەن .

چونکە هەموو کەسێك بۆی هەیە بە ڕێزەوە سەر لە مالّی خوا بدات و تەوافی بکات ، بە تایبەتیی لە ( أشهر الحرم ) دا کە لەو مانگانەدا دوژمنان چەکیان دائەنا و جەنگیان نەئەکرد، بەلاّم قورەیشی خوانەناس ئەم مافەی لە موسلّمانەکان زەوت کرد و بڕیاری دا نەهێلّێ موسلّمانەکان پێ بنێنە خاکی مەککەوە . دوای وت و وێژ و هاتوچۆیەکی زۆر ئەوەندەی نەمابوو جەنگ بەرپا بێت ـ هەرچەندە موسلّمانەکان خۆیان زۆر لا ئەدا چونکە ئەو شوێنە لەبەر پیرۆزیی نەئەشیا جەنگ و هەرای تێدا بکرێت ـ موسلّمانەکان دوای قیرسچمەیی و پێداکوتانی قورەیش و دەست درێژییەکانی پەیمانی جەنگ کردنیان بە پێغەمبەری ﷺ دا و ، نوسەیبەش یەکێ بوو لەو پەیماندەرانە ! ئەم پەیمانە ناو نرا پەیمانی ( الرضوان ).

# شەهیدی بێ باك

ڕۆژ بە ڕۆژ و ساڵ بە ساڵ دینی ئیسلام لە پەرەسەندندا بوو .. دڵان بە ئیسلام ڕۆشن ئەکرانەوە .. کۆمەڵی خوا هەنگاوی بەرەو ئامانج ئەنا.. ئامانجی ڕزگارکردنی مرۆڤ.. هەموو مرۆڤ .. لە سەرانسەری سەرزەوییدا .. حەبیبی کوڕی زەیدیش لە ئوحود بە دواوە بەشداریی جەنگەکانی نێوان ئیسلام و نەفامیی کرد.. بەڵام چۆن بەشدارییەك .. هەتا ئەهات دڵی لەسەر ئیسلام دائەمەزرا و ، جار بە جار زیاتر حەزی لە فیداکاریی و قوربانییدان ئەکرد لە پێناوی ئیسلامدا.. ژیانی تایبەتیی خۆی لە بیر چووبوەوە .. خوای گەورە ویستی وابوو حەبیب پەروەردە بکا و بۆ ڕۆژی قوربانیی و فیداکاریی گەورە ڕای بهێنێ .. تا ببێتە پەند و ئامۆژگاریی بۆ هەموو موسڵمانێك بە درێژایی مێژوو ، بە ڕادەیەك کە هەموو فیداکارییەك لە ئاستیدا دەستەوسان بێت ..

ئەوەبوو خوای گەورە ویستی وا بوو بە دەست و بازووی هاوەڵە دڵسۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ دینی ئیسلام پەرە بسێنێ و بڵاو ببێتەوە . بە ڕاستیی شیاوی ئەو بەخششە گەورە بوون ، چونکە بە ڕاستیی و پاکیی موسڵمان بوون.. بە جوانیی ئیسلام گەیشتبوون .. بە ڕێك و

پێکییش ئەو تێگەیشتنەیان لە ژیاندا جێبەجێ ئەکرد.. کە دانیشتوانی دوورگەی عەرەبییش پەرەسەندنی لەشکری خواناس و دەست و دەم و دڵ و دەروون پاکیان بە چاوی خۆیان دیی ، بە تایبەتیی دوای رزگارکردنی مەککە، خۆیان پێ نەگیرا ، ئەوەبوو لە ساڵی نۆیەمدا هەموو هۆزێك نوێنەرێکی لە پیاوە تێگەیشتووەکانی پێك هێنا و ، رەوانەی پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی کرد ، تا دڵسۆزیی و ئامادەیی خۆیان بۆ دینی نوێ و وەرگرتنی دەرببڕن و ، رووناکیی رێبازی بێگەردی پەروەردگار بگەیەننە ناوچەکەی خۆیان ..

یەکێ لەو نوێنەرانە نوێنەری نەوەی حەنیفە بوو کە لە ژووررووی بانی نەجدەوە هاتبوون ..

نێرراوانی نەوەی حەنیفە گەیشتنە مەدینە و سەرکردەکەشیان پیاوێ بوو بە ناوی موسەیلەمەی کوڕی حەبیبی حەنەفیی .. موسەیلەمە بە خۆی و پیاوەکانیەوە گەیشتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا و لەبەر دەستیدا موسڵمان بوونی خۆی و خزمەکانی دەربڕیی .. پێغەمبەری خواش ﷺ بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردن و دوای حەسانەوەیان فەرمانی دا هەر یەکە خەڵاتێکیان پێشکەش بکرێت و بە وێنەی ئەوانیش بۆ موسەیلەمەی سەرگەورەیان ..

لەو ماوەیەدا کە موسەیلەمە لە مەدینەدا مایەوە ، سەرنجی ژیانی کۆمەڵی موسڵمانی ئەدا ، بۆی دەرکەوت ، بە شێوەیەکی بێوێنە موسڵمانەکان پێغەمبەری خۆیان ﷺ خۆش ئەوێت و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانەکانی ئەکەن .. هیچ سەرکردەیەك ئەو رێز و خۆشەویستیەی نیە.. لە جیاتیی ئەوەی ئەویش ببێتە سەربازێکی دڵسۆز بۆ ئیسلام و ، سەرکردەیی خزمەکانی لە بەرزکردنەوەی فەرمایشتی خوادا بکا و ، بەشداریی لە رووخاندنی قەڵای زۆر و ستەمی لەشکری شەیتاندا بکا .. لە جیاتیی ئەمە ، دڵە پیسەکەی کەوتە تەماعی ئەو پایە و پلەیەی کە خوا بە پێغەمبەری بەخشیی بوو .. وای ئەزانی بە فێڵبازیی و بە زمانی لووس ئەتوانێ بەو شێوەیە پشتیوانی دڵسۆز و بەغیرەت و خۆنەویست لە خۆی کۆ بکاتەوە ، تا بگاتە ئەو پایە و پلەیە ، هەر لە رێگای گەڕانەوەیدا بۆ وڵاتی نەجد ، موسەیلەمە لە ئیسلام پەشیمان بووەوە و کاتێك گەیشتە بەرەوە دەستی بە بانگ کردنی خەڵکی کرد و بە ئاشکرا پێی وتن کەوا ئەویش پێغەمبەرە و خوا ناردوویەتی بۆ سەر نەوەی حەنیفە ، هەروەك موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ناردووە بۆ سەر قورەیش..

چڵکاوخۆران لە دەوری جەمیان خوارد .. باوەڕیان بە درۆزنی خوانەناس هێنا کە گوایە ئەویش پێغەمبەری خوایە و مەردمەکان بۆ سەر دینی خوا بانگ ئەکات .. ئەوانەی کە شوێنی ئەکەوتن ئارەزوو و

هەوەسکاریی جۆر بە جۆر پاڵی پێوە ئەنان .. بەڵێ قەڵای درۆ و فیشاڵ و خراپکاریی بناغەی پڕ کرایەوە ، بە شێوەیەك هەموو ئەندامێکی ئەو کۆمەڵە جگە لە زۆر ساویلکەکان ئەیزانیی ئەمە کارێکی ناڕەوایە و دەست هەڵبەستێکی نەگونجاوە ، بەڵام دەروونی لار و وێریان پاڵی پێوە ئەنان تا ویژدانیان دەم کوت بکەن و بە دەم راستیی و دروستیی ئەو کارە ناڕەوایە و بیرە لارە دەربخەن ، هەتا یەکێ بەوپەڕی بێئابڕوویییەوە ئەیوت:

شایەتیی ئەدەم کە موحەممەد راستگۆیە و موسەیلەمەش درۆزنە ، بەڵام من درۆزنی رەبیعەم لا خۆشەویستترە لە راستگۆی موضەر !

بەرە بەرە قەڵای ستەمکاریی و درۆ و دەلەسە بەرز کرایەوە ، کاتێ موسەیلەمە زانیی خەڵکێکی زۆر وا بە دوایەوە ، نامەیەکی بەم شێوەیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیی :

( لە موسەیلەمەی پێغەمبەری خواوە بۆ موحەممەدی پێغەمبەری خوا، سەلامت لێبێ .

من لەم کارەدا کراوم بە هاوبەشی تۆ ، بۆیە نیوەی زەویی بە ئێمە رەوایە و ، نیوەشی بە قوڕەیش ، بەڵام قوڕەیش نەتەوەیەکی دەست درێژیی کەرن ) .

دوان لە پیاوەکانی بۆ هەڵگرتنی نامەی سادە و منالآنـە هەڵبـژارد .
کـاتیٚ کـە نامـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ خوێندرایـەوە، بـە دوو پیاوەکـەی فەرموو:

ئەی ئێوە چیی ئەڵێن ؟!

وەڵامیان دایەوە : ئەوە ئەڵێین کە وتوویەتی .

پێی فەرموون :

بەخوا ئەگەر لەبـەر ئـەوە نـەبێت کـە نێـرراوان نـاکوژرێن لـە ملـی هەردووکتانم ئەدا ..

پاشان نەمەی بۆ موسەیلەمە نووسیی و دایە دەست دوو پیاوەکەی :

( بسم الله الرحمن الرحيم ..

( لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ موسەیلەمەی درۆزن .. سەلام لەو کەسەی کە دوای ڕێگای ڕاست کـەوتووە .. زەویـی مـوڵکی خوایـە ویسـتی بـۆ کـام بەنـدەی هـەبوو کاروبـاری زەویـی ئەداتـە دەسـت و سەرەنجامیش هەر بۆ بەندە لەخواترسەکانە ) .

موسـەیلەمەی دڵ و دەروون ڕەش و پـیس ، نیـازی نـەبوو گـویٚ لـە ئامۆژگاریی بگرێت ، چونکە هەوای گەورەیی و دەسەڵات و پایـە و پلـە

لـه کەللـەی دابـوو .. ئـەو ڕێـز و خۆشەویـستییەی کـە موسـڵمانەکان بەرامبەر بە پێغەمبەری پێشەوا دەریان ئـەبڕیی کـوێری کردبـوو و تـازە ڕاستیی نەئەبینی و ، گەیشتن بەو ئامانجە تاکە هیوای ژیانی بوو.. بۆیـە ڕۆژ بە ڕۆژ بێوچان هەوڵی چاوبەستن و دەست بڕینی مرۆڤـەکانی ئـەدا و بە وتەی لووسی هەڵبەستراو هەڵی ئەخەڵەتاندن ، تا ببنە بەندەی ئەڵقـە لە گوێی ..

کاتێ خراپەی موسەیلەمە پەرەی سەند و دەنگ و باسی بڵاو بـۆوە ، پێغەمبەر ﷺ وای بە چاك زانیی نامەیەکی تری بۆ بنێرێ تا لە خراپیی کارەکـەی ئاگـاداری بکـا و ، لـەو گومڕاییـیـەی کـە دەسـتی داوەتـێ دوورەپەرێزیی بکـات .. بـۆ هـەڵگرتنی ئـەم نامەیـەش پاڵـەوانی لاوی دڵسۆز و بەوەفا و چاونەترس حەبیبی کوڕی زەید ( کـوڕی نوسـەیبە ) ی هەڵبژارد .

حەبیب گەنجێکی تازە پێگەیشتووی کۆڵنـەدەر و ، خـاوەن بڕوایـەکی بەتین بوو .. خاوەن بڕوایەك بوو کە بە ئەتۆم دڵ و دەروونی نەگۆڕڕێ .

بەڵێ نامەی پێغەمبەری خۆشەویستی ﷺ هـەڵگرت و، لـە مەدینـە بەرەو خۆرهەڵات بۆ وڵاتی نەجد کەوتە ڕێ .. شـەوی ئەدایـە دەم ڕۆژ و ڕۆژی ئەخستە سەر شەو بە چۆڵیی و ئاوەدانییدا .. بە بەرزیی و نزمییدا

هەنگاوی هەڵ ئەگرتن ، تا ویستی خوا وابوو تەمەنی پیرۆزی لـە وڵاتـی نەوەی حەنیفەدا کۆتایی پێ بێت ..

سوارچاکی موسڵمان گەیشتە وڵاتی موسەیلەمە و نامـەی پێشـەوای دایە دەست . هەر ئەوەندە بـوو موسـەیلەمەی درۆزن و ساختەچـیی لـە نامەکە تێ گەیشت، لە داخاندا ورگی ئاوسا و تووکی لەشی گرژ بـوون و ، نیاز پیسیی لە دەم و چاوە زەردباوەکەیدا ئەخوێنرایەوە .. لە تەمەنیدا رەنگە رقی وا هەڵنەستابێ .. هەموو فەرموودەیـەکی نامەکـە تیرێکـی جەرگ بڕ بوو .. لە بێ دەسەڵاتییدا ویستی داخی دڵی خۆی بە حـەبیبی هەڵگری نامە بڕێژێ .. خوانەناسی درۆزن یاسـای نەفامییشـی لـە یـاد نەماوە چ جای یاسای ئادەمییان .. لـە هـیچ یاسـایەکدا کـەس لاقـەی نێرراوان و نامە هەڵگران ناکات ، چونکە ئەوانە تاوانێکیان نیە ..

فەرمانی دا بە چلکاوخۆرەکانی تا دەسـت و پێـی حـەبیب ببەسـتن و بەندی بکەن تا سبەینێ لە چێشتەنگاودا بیبەنە بەردەسـتی .. بـۆ رۆژی داهاتوو دیواخان رازایەوە و موسـەیلەمە لـە شـوێنی خـۆی دانیشـت و دەست و پێوەندی خراپکاریش لە دەوری کۆڕیان بەست .. ئەو رۆژە ماوە درا خـەڵکیی بچـێتە ژوورەوە . پاشـان فـەرمانی دا حـەبیبی کـۆت و زنجیرکراو بێتە ژوورەوە ..

کۆمەڵی خوانەناس چاویان بڕیبووە حەبیب .. ئەویش موسڵمان ئاسایی بە باڵا بەرزەکەیەوە بە وێنەی داری عەرعەر قنج راوەستا و ، بە وێنەی نەڕەشێر نەت ئەزانیی ئەمە دیلی بەردەستی خوانەناسانە .. بە هیچ شێوەیەك باکی نەبوو .. چونکە ئەرکی سەرشانی خۆی جێ بەجێ کردبوو .. ئیتر هەرچیی بەسەردا بێت ئامادەیە و مێشێك میوانی نیە .

بڕوای دامەزراو بە جۆرێك دڵ و دەروونی مرۆڤ رزگار ئەکا ئەگەر هەرچیی لێ بوەشێتەوە جێگای سەرنج و سەرسوڕمان نیە !!

موسەیلەمە ئاوڕی بۆ لای حەبیب دایەوە و لێی پرسیی: شایەتیی ئەدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە؟

وتی : بەڵێ ، شایەتیی ئەدەم کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە .

وەختە بوو داخ موسەیلەمە بکوژێت ، دوای ئەوە پرسیی :

شایەتییش ئەدەی کە منیش پێغەمبەری خوام ؟

حەبیب بە گاڵتە پێکردنێکی جەرگ بڕەوە وەڵامی دایەوە و وتی :

گوێم لە بیستنی ئەوەی کە ئەیلێیت کەڕە .

بەم وەڵامە موسڵمانانە رەنگی موسەیلەمە گۆڕا و لە داخا لێوی هاتە لەرزە .. چۆن داخ و خەفەت نای کوژێ ئەو لەلای شوێن

کەوتوەکانی خۆی بە پێغەمبەر داوەتە قەڵەم ، کەچیی وا گەنجێك لەبەردەمیاندا بەو شێوەیە وەڵامی ئەداتەوە ؟ موسەیلەمە ـ بە وێنەی هەموو ستەمکارێکی خوانەناس ـ هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ بە جەللادی خوێن ڕێژ بڵێت :

پارچەیەك لەلاشەی ببڕە !

خوێن ڕێژی خوانەناس هەڵمەتی بردە سەر نەوجەوانی موسڵمان و بە شمشێر پلە گۆشتێکی گەورەی لە لەشی بڕیی و پلە گۆشتەکەش بە سەر زەوییدا خولی ئەخوارد ..

موسڵمانی خواناس هەروەك هیچ نەبووبێت ، بە باڵا عەرعەرەکەیەوە لەبەر دەم موسەیلەمەدا جووڵەی نەکرد..

دیسان پرسیاری لێ کردەوە :

شایەتیی ئەدەی، کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ؟

وتی : بەڵێ ، شایەتیی ئەدەم کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ..

پرسیی : شایەتییش ئەدەی کە منیش پێغەمبەری خوام ؟

وەڵامی دایەوە : پێم وتی : گوێم لە بیستنی ئەوەی کە ئەیڵێیت کەڕە.

دیسان خوانەناسی بێویـژدان فـەرمانی بەسـەر جەللادەکەیـدا دا تـا پارچەیەکی تر گۆشتی لاشەی ببڕێت.. چـڵکاوخۆری دڵڕەش پارچـەیەکی تری بڕیی .. ئەویش بەسەر زەوییدا خولی ئەخوارد تا چووە تەنیشت پلی یەکەم و وەستا .. خەڵکیی لە خـوا یـاخیی‌بـووش هـەموویان سـەیریان ئەکرد و چاویان زاق بـوو بـوو و سـەریان لـە دامـەزراویی و بـێباکیی موسڵمانی خواناس سوڕ ما بوو . سەریان سـوڕ ئـەما : ئـەم موسـڵمانە چۆن و بە چ شێوەیەك باوەڕی بە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا هێناوە!! تا چ رادەیەك ئامادەی کۆڵنەدان و فیداکارییە لە پێنـاویی بیروباوەڕەکەیـدا .. لەو بڕوایەدام کـە زۆریـان پەشـیمانی شـوێن کـەوتنی موسـەیلەمەی بێویژدان بووبن ، بەڵام دەسەڵات چیە ؟

هەر چۆن بێ حەبیبی بێباك دەرسێکی دادان کەوا شوێن کەوتنی ئەم بۆ پێغەمبەرەکەی وەك هـیچ شـوێن کـەوتنێکی تـر نیـە .. ئـەم هـیچ بەرژەوەندییەکی خۆی نەهێشتۆتەوە کەوا نەی کاتە قوربانی ئەو رێبازەی کە خوای گەورە ناردوویەتی .. تازە هیچـێکی نیـە نـەی‌کاتـە قوربـانی ئیسلامی بێگەرد ..

کاری موسەیلەمە بەمەوە نەوەستا .. کـۆڵی نـەدا . هـەر پرسـیاری ئەکرد و حەبیب خۆی کەڕ ئەکرد و جـەللادی خـوێن ڕێـژیش بـە نـاڕەوا پارچەیەکی تری لە لاشەی ئەبڕیی ، دوای ئـەوە حـەبیب شـایەتیی ئـەدا کەوا موحەممەدە پێغەمبەری خوا .. ئەم کارە بەردەوام بوو هەتا نزیکەی

نیوەی لاشەی حەبیب کرا بە پلە گۆشت و لەسەر زەوییەکە پرژ و بلاو بۆوە و ، نیوەکەی تریشی یەك پارچە بە پێوە وەستا بوو و شایەتیی ئەدا موحەممەدە پێغەمبەری خوا ﷺ !! موحەممەدە پێغەمبەری خوا ﷺ !!! تا گیانی پاك و بێگەردی لە لاشەی دەرچوو و ناوی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ـ کە شەوی عەقەبە پەیمانی بەخت کردنی سەروماڵی پێ دابوو ـ بەسەر زمانیەوە بوو ..

گیانی شیرینی حەبیب دەرچوو کە دوایین وتەی سەرزاری ناوی پێغەمبەری خوا بوو ..

بەمە پاڵەوانێکی موسڵمان گیانی لە دەست دا ..

لە ئاوارەییدا .. بێکەس و بێدەر .. بێوەسیەت و قسە و باس .. نیوەی لاشەکەی پلە گۆشت و لە ناکاودا نیوەکەی تریشی گیانی دەرچوو و کەوتە بەردەست کۆمەڵی خوانەناسی بێویژدان ..

حەبیب بەم کارەی بۆ موسەیلەمە و شوێن کەوتووەکانی و ، بۆ هەموو موسەیلەمەیەك و دار و دەستەکانیانی سەلماند کەوا شوێن کەوتن و گوێڕایەڵیی موسڵمان سەرزاریی نیە و لە شەقامی پاندا نیە ، بەڵکو تا دواتنۆکی خوێنە .. تا بڕینی دوایین پلە گۆشتە ..

پێـی سـەلماندن کـەوا دەسـەڵاتی لەشـکری شـەیتان تـەنها بەسـەر لاشەدایە، بەڵام دڵ و دەروونی جیهانێکی سەربەخۆی جیـاوازە و، ئـەوان توانای گەیشتن بەو جیهانە و دەست ڕۆشتن بەسەر ئەو جیهانەیاندا نیە ..

حەبیبی شەهید بەم کارەی بـۆ هـەتا هـەتایی ئـاگرێکی بلێسـەداری خستە دڵی برا موسڵمانەکانیەوە تا کەمتەرخـەمیی نەکـەن و مـاوە بـە دوژمنی خوانەناس نـەدەن دەسـت بخاتـە کاروبـاری موسـڵمانەکانەوە و دینەکەیان ژێر پێ بخات .

بەم کارەی سەلماندی کە موسڵمان چەند بێباکە و ، ناوی پێغەمبـەری خۆشەویستیشی بەرزکردەوە و بۆ جیهانی دەربڕیی کە تەنها ئەم خـاوەنی کۆمەڵێکی دڵسۆزی بەوەفای بێباکی ڕەوشـت پاکـە.. تـا مرۆڤایـەتیی بزانێ کەوا هەڵگرانی ئیسلام مەبەستیان رزگارکردنی مرۆڤـە و هـەموو بەرژەوەندییـەکی تایبـەتیی ژێـر پـێ خـراوە .. تـا مرۆڤایـەتیی بزانـێ موسڵمانان کۆششیان بۆ بەختەوەریی مرۆڤەکانە و بەس .. بەڵام خۆیـان تاکە ئاواتیان ڕەزامەندیی خوا و گەیشتن بە بەهەشتی بەرینە .. دیارە بە بیرکردنەوە لەم ئاواتە ئادەمیزاد ئـەتوانێ بەرژەوەنـدیی تایبـەتیی خـۆی بخاتە پشت گوێ و هەوڵ و کۆششی بۆ حەسانەوەی ئادەمییەکان تـەرخان بکات ..

هەواڵی پاڵەوانی ئاوارەی شەهید گەیشتە لای دایکی ، ئەویش خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە بە وێنەی ئافرەتێکی موسڵمانی تێگەیشتوو و فیداکار وتی :

بۆ بەرگەگرتنی ئەم جۆرە هەڵوێستانە پەروەردەم کردووە و ، پاداشتم لە خوای گەورە ئەوێت ..

شەوی عەقەبە هێشتا منداڵ بوو پەیمانی بە پێغەمبەر ﷺ دا و ئەمڕۆ پەیمانەکەی بردە سەر .. ئەگەر خواش دەسەڵاتی بەسەر موسەیلەمەدا دام ئەبێ کچەکانی کوڵمی بۆ بڕنن ..

( بۆ بەرگەگرتنی ئەم جۆرە هەڵوێستانە پەروەردەم کردووە ! ).

ئەمە تەنها رستەیەکە ، بەڵام هیچ شاخێك هاوسەنگیی ناکات .. چونکە دوای لێقەومان مەگەر مرۆڤی خاوەن ئیمان وەها دامەزراو بێت و بتوانێت وا بڵێت .. بوێژانی سروودی :

دایە گیان توخوا بەسیەتی گریان

بەسیە ئاخ و ئۆف ، بەسە قوڕ پێوان

با لە ژیانی رۆژانەدا جێ بەجێی بکەن .. یەك نموونە بەسە کەچیی دەست ناکەوێ !!

# موسەیلەمەی خەجاڵەت

نوسەیبە ئارامی گرت .. کاری دایە دەست پەروەردگار تـا نەخشـەی بۆ بکێشێ و تەنها چاوەڕوانی ویستی ئەوی ئەکرد .. تا زۆری پێ نەچوو دوای کۆچـــکردنی پێغەمبـــەر و هەڵگەڕانـــەوەی هەنـــدێ هـــۆزی تێنەگەیشتووی بە سەرزار موسڵمان بوو لە ئیسلام و خۆ ئامادەکردن بـۆ لەناوبردنی دەوڵەتی پڕ دادپەروەریی قورئانی پیرۆز .. ئەوەبوو ئەبوبـەکر ﷺ پاڵەوانانە بڕیاری بەگژاچوونی هەموو هەڵگەڕاوەکانی دا هەرچـەندە لـەم رایەیـدا تـەنیاش بـوو .. یـەکێ لـە لەشـکرە موسـڵمانەکان بـە سەرکردایەتیی شێری خوا خالیدی کوڕی وەلید بەرەو ناوچـەی یەمامـەی وڵاتی موسەیلەمە کەوتە رێ ، تا خوانەناسی درۆزن دەست کۆتـا بکـات و مرۆڤە خەڵەتاوەکان و زۆر لێکراوەکان بێننەوە ژێر ئاڵای دادپـەروەریی ئیسلام ..

نوسەیبە و عەبدوڵڵای کوڕی لەگەڵ ئەم لەشکرەدا کەوتنە رێ تـا بـە تێك شکاندنی لەشکری شەیتان و لەناوبردنی موسەیلەمەی خوانـەناس و درۆزن و ، موسڵمان کردنەوەی ناوچەکە دەست بەسـەر دڵیانـدا بهێـنن و خوێنی شەهیدی ستەم لێ کراویان دەست کەوێتەوە ..

موسڵمان نابێ بۆ تۆڵە بگەڕێ ، بەڵکو هەرکاتێ دوژمن وازی لە دوژمنایەتیی هینا و هاتە ریزی شوێن کەوتوانی خواوە هەموو تاوانێکی لەسەر لا ئەچێ و برایەکی موسڵمانی بێ تاوانی لێ دەرئەچێ . بەڵام لەو لاشەوە وازهێنان لە خوانەناسان و تۆڵەنەسەندن و وەرنەگرتنەوەی ماف ، موسڵمانێتیی پێ ناوترێ . چونکە موسڵمان هەروەك لە هەموو کەسێك چاوپۆشیی زیاترە ، هەروەهاش ئەبێ غیرەتی لە هەموو کەسێك زیاتر بێت بۆ تۆڵەسەندن لەو دوژمنانەی کە دەست درێژیی ئەکەنە سەر ئیسلام و موسڵمانەکان ..

نوسەیبە و عەبدوڵڵای کوڕی بە بیرباوەڕ و توانای موسڵمانەوە کەوتنە ڕێ ، تا قەڵای ستەم بڕووخێنن و نەیەڵن درۆزنی فێڵباز لەوە زیاتر هەژاران فریو بدات .. نوسەیبە تەمەنی لە شەست ساڵ تێپەڕیی بوو ، بەڵام هێشتا نە پیریی و نە بێهێزیی روویان تێ نەکردبوو ..

ئاواتی ئەوەبوو خوا ماوەی بدا دوژمنی خوا و پێغەمبەر بکوژێ و تۆڵەی کوڕەکەی و ئیسلامی لێ بکاتەوە ..

جەنگ لە نێوان لەشکری خالید و موسەیلەمەدا بەرپا بوو .. جا هەرچەندە لەشکری موسڵمانەکان زۆر ڕێك و پێك و جەنگاوەرەکانیشی لێ هاتوو بوون ، بەڵام لەو لاشەوە لەشکری موسەیلەمە گاڵتەی پێ نەئەکرا و ئەوەندە بەهێز بوو یەکەم جار لەرزەی بە موسڵمانەکان خست

و تووشی شکانێکی ناهەمواری کردن، تا سەرکردەی ئـازا خالیـد کـوڕی وەلید ، هاواری کرد: ( وا مـحمداه ) !

خۆزگە هەر کاتێ ئیسـلام ئەکەوتـە مەترسییەوە سـەرکردەیەك بـە دەنگێکی پڕ لە سۆزەوە هاواری بکردایە :

( وا مـحمداه ) .. ( وا إسـلاماه ) ! تا موسڵمانەکان تۆزی سەرچاوی خۆیانیان بتەکاندایە !!

بە نرکەی خالید دڵی موسـڵمانەکان هاتـە جـۆش : مەترسـیی رووی کردۆتە ئیسلام .. دینەکەمان لە مەترسییدایە .. رەنجی چەند سـاڵەمان ئەم سات و ئەو ساتیەتی .. زەردەخەنە کەوتۆتـە سـەر لێـوی شـەیتانی کۆست کەوتوو .. ئەو شەیتانەی کە بە سەردەرهێنانی رۆشنایی ئیسـلام تاریکیی و زەبوونیی دڵ و دەروونی گرتبۆوە .. ئـەو شـەیتانەی کـە بـە دروست بوونی کۆمەڵی قورئان کۆمەڵە شل و شۆڵەکەی تـەفروتوونا بـوو بوو .. وا ئەم ساتە لـە سـایەی دەسـت و بـازووی لەشـکری فریـودراوی موسەیلەمەدا خەریکە خۆشیی رووی تێ ئەکات .. بە خەیاڵی خـۆی بـە تەمایە رووناکیی ئیسلام بە دەم و پلی درۆزنی بێویـژدان بکوژێتـەوە .. خـۆی گێـل ئـەکا ئـەگینا موسـەیلەمە و هـەزارانی وەك موسـەیلەمە سەرشۆڕیی مێژوو و رۆژی قیامەت بەولاوە لە بەربەرەکانێ کردن لەگـەڵ ئیسـلامدا و دژایـەتیی کـردن لەگـەڵ کۆمـەڵی خـوادا چییان دەسـت ئەکەوێت ؟

بە نرکەی خالید لەشکری تێك شکاو رۆیشت و لەشکرێکی تـر هاتـە جێگەیەوە .. موسڵمانان سەر لە نوێ خۆیان رێك خستەوە و بەرامبەر بە لەشکری شەیتان وەستان و ، نوسەیبەش خۆی پـێ نـەگیرا و دەستی دایە شمشێر و لەگەڵ کۆمەڵێ لە سوارچاکانی ئەنصاردا هێرشیان کـردە سەر دوژمنان .. بکوژ و ببڕ شمشێریان نایە گەردنی ئـەو پـەیمان شـکێنە ناپاکانەی کـە دوای موسـڵمان بـوون هەڵگەڕابوونـەوە.. لـەم هێرشـەدا نوسەیبە زۆر و زەبەندە زامدار بـوو و ، قۆڵێکیشـی پـەڕیی ، بـەڵام بـە جەرگێکی موسڵمانانەوە کۆڵی نەدا و بـاکی نـەبوو .. هـەروا بـەردەوام کۆششی ئەکرد و جەنگاوەری ئەکوشت و ، بە وێنەی شێری بێشـە بـەناو خەڵکەکەدا ئەسووڕایەوە و هاواری ئەکرد :

کوانێ دوژمنی خوا ؟

دوژمنی خوام پیشان دەن ..

هەتا لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕیدا گەیشتنە لای موسەیلەمە و ئـەوانیش یارمەتیی ئەو موسڵمانانەیان دا کە خەریکی کوشتنی بوون ، بەمـە بـە ئاوات گەیشت و ، دڵ و دەروونی فێنك بۆوە و ، سوپاس و ستایشی ئەو خوایەی کرد کە ماوەی دا تا بە دەستی خۆی تۆڵـەی حـەبیبی شـەهیدی کردەوە و ، ئەو ئاواتەی نەبردە ژێر گڵ و بە چاوی خۆی خەجاڵەت بـوون و سەرشۆڕیی موسەیلەمەی دیی .

ئافرەتی پاڵەوان ـ دوای سەرکەوتنی لەشکری ئیسلام ـ گەڕایـەوە بـۆ مەدینەی پایتەخت و قەڵای ئیسلام .. بەڵام بە قۆڵێکەوە .. بە ئـێش و ئازارێکەوە کە هەموو کەسێك بەرگەی ناگرێت .

کاتێك کە ئەبوبـەکر لـە هاتنـەوەی ئاگـادار بـوو ، بـۆ پیرۆزبـایی و دڵخۆشیی دانەوەی سەری لێ دا .

نوسەیبەی ئیمان دار لە سـایەی دەوڵـەتی قورئانـدا لەوپـەڕی ڕێـز و پایەدارییدا خەریکی خواپەرستیی بوو ..

ئەوەبوو لە سەردەمی خەلیفـە عومـەردا ﷺ چـەند سەرپۆشـێك بـۆ خەلیفە هاتن ، تا بەسەر خێزانە موسڵمانەکاندا بیان بەخشێتەوە . بەڵام دانەیەکیان زۆر گەورە و چاك بوو . موسڵمانێك بە خەلیفـەی وت : ئـەم سەرپۆشەیان بایی ئەوەندە ئەبێت ، خۆزگە ئەت نارد بۆ صەفیەی کچـی ئەبوعوبەیـد کـە ژنـی عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەرە و هێشـتا نـەی گواستۆتەوە.

خەلیفە وەڵامی دایەوە :

ئەی نێرم بۆ یەکێك کە لەو شیاوتر بێت پێی :

ئوم عومارە ، نوسەیبەی کچی کەعب ، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە ئەی فەرموو : ( ما التَفَتُّ يَميناً وَلا شِمالاً إلاَّ وأنا أَراها تُقاتِلُ دُونِي ) .

نوسەیبەی بە ئاوات گەییو .. هەروا لە شاری پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە هەتا خوا ویستی وابوو بەندەی مل کەچ و گوێ ڕایەڵی دوای تەواوبوونی گەشتی زەمینیی بەرێتەوە بۆ لای خۆی تا گەیشتە ئەو جیهانەی دەست پێ بکا و بە دەروونێکی پڕ لە ڕەزامەندییەوە بە دیداری پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ شاد ببێتەوە ..

حەبیب شەهید بوو و نوسەیبەش کۆچی دوایی کرد . بەڵام عوبدوڵڵای کوڕی تا ماوەیەکی زۆر هەروا مایەوە .. هەر خەریکی هەوڵ و کۆشش بوو بۆ بەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلام و بە هیچ شێوەیەك ساتێکی ژیانی بە فیڕۆ لە کیس نەئەدا و وچانی نەئەگرت . عەبدوڵڵا مایەوە هەتا سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویە ، بەڵام دانی بە ڕەوایەتیی خیلافەتی یەزیددا نەئەنا .. چونکە بە جوانیی لە ئیسلام گەیشتبوو .. ئەیزانی کێ شایانی خیلافەتە .. کێ شایانی پێ سپاردنی کاروباری موسڵمانانە .. هەڵبژاردنی ئیسلامیی شتێکە و هەڵپە و دەست بە سەرا گرتنیش شتێکی ترە.

بەڵام لە یادمان بێت ئەگەر موسڵمان بە راستیی لە ئیسلام بگات و لە سەرچاوە پاکەکەی ( قورئان و حەدیث) ەوە تێ گەیشتنەکەی هەڵ بگۆزێت و ، لەگەڵ خوادا راست بکات ، ئەوا تووشی هیچ هەڵوێستێکی لار و وێر نابێت و بە ئاسانیی راست و ناڕاست جیا ئەکاتەوە .. ئەوەتا قورئان ئەفەرموێ :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ ( الأنفال : ٢٩ ) .

بەڵێ شاری پێغەمبەری خۆشەویست، کە پڕی بوو لە هاوەڵە تێگەیشتووەکانی پێغەمبەر و شوێن کەوتووە کانیان ـ التابعین ـ بە هیچ شێوەیەك دانیان بە رەوایەتیی خەلافەتی یەزیدی کوڕی موعاویەدا نەدەنا و ، مل کەچی فەرمانەکانی نەبوون ، بۆیە یەزید بۆ پاراستنی کورسی‌یەکەی ناچار بوو بە سەرکردایەتیی موسلیم ی کوڕی عوقبە لەشکرێك بنێرێتە سەر مەدینە تا مل کەچیی بە دانیشتوانی دەربخات .. دانیشتوانی مەدینەش ناچاربوون لە دژی پاشای رۆژگار بەرگریی لە شارەکەیان بکەن ، بۆیە عەبدوڵڵاش یەکێ بوو لە بەرگریی کەران تا بە شەهیدیی سەری نایەوە ، بێ ئەوەی مل بۆ فەرمان ڕەوای هەڵنەبژێرراو کەچ بکا .. خوا لە هەموویان خۆش بێت .

# سەرچاوەکان

| کتێب | دانەر |
| --- | --- |
| ١ - الإستيعاب | إبن عبد البر |
| ٢ - الإصابة | العسقلاني |
| ٣ - حلية الأولياء | الأصبهاني |
| ٤ - حياة الصحابة | الكاندهلوي |
| ٥ - السيرة النبوية | إبن هشام |
| ٦ - صور من حياة الصحابة | عبدالرحمن الباشا |

# ناوەڕۆك

# نوسەیبەی
## کچی کەعب

یەکێکە لەو ئافرەتە قارەمانانەی
کە بە دڵ و بە گیان باوەشی بە
قورئاندا کرد و ، مەردانە بەرگریی
لە دینی ئیسلامی بێگەرد کرد و ،
سەر و ماڵی بە ئاسانیی لە پێناوی
خوادا بەخشیی ، تا ڕێبازی قورئان بە
جیهان بگات و ، مرۆڤەکان
هیدایەت وەر بگرن و ، لە
سەرشۆڕیی قیامەت ڕزگار بن ..




نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
Mob: +964 750 460 51 22
Tel: +964 750 818 03 66
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com


